# قوربانی

## چۆنییەتی .. وحوکمەکانی

## الأُضْحِيَةُ..كَيْفِيَّتُهَا...وَأَحْكَامُهَا


نوسینی

عثمان أحمد حاتم





ذوالحجة ـ ١٤٤٢هـ

# پێشەکی

**إِنَّ الْحَمْد لِلّهِ، نَحْمَدهُ وَنَسْتَعِينهُ وَنَسْتَغْفِره، وَنَعُوذ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ومِنْ سَيْئاتِ أَعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّه فَلَا مُضِلّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِي لَهُ وَأَشْهَد أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَحْده لَا شَرِيك لَهُ، وَأَشْهَد أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده وَرَسُوله.**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾(آل عمران).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾(النساء).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾(الأحزاب).

**أَمَّا بَعْد: فإنّ أصْدَقَ الحَديثِ كتابُ اللّهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأمُورِ مُحْدَثاتُها، وكلَّ مُحْدَثةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضَلالَةٌ، وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ.**

قوربانی یەکێکە لە دروشمە گەورەکانی ئیسلام، و بە گەورە دانانی نیشانەی لە خوا ترسان و پارێزکاری دڵە، پێویستە موسڵمانان هەوڵ بدەن بەوشێوەیە قوربانی بکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی کردووە، لە دووتوێی ئەم نامیلکەیەدا

بەرچاوڕوون دەبن كە چۆن قوربانی بكەن، و وەڵامی زۆربەی ئەو پرسیارانەی تێدا دراوەتەوە كە دروست دەبێت سەبارەت قوربانیكردن، بە هیوام خوێنەرانی سودی لیٚ ببینن.

وأسأل الله التوفيق والسداد

عثمان أحمد حاتم

گەرمیان ـ كەلار

٢ی ذوالحجەی١٤٤٢هـ

١٢ی تەموزی٢٠٢١

  

## پێناسەی قوربانی

لە زماندا: ئیبن مەنزور دەڵێت: مەڕێکی سەربڕی لە کاتی چێشتەنگاودا (ضحی) لە بنەڕەتدا بەمە دەگوترێت، و بەکاریش دەهێنرێت بۆ ئەو سەربڕینە هەموو کاتەکانی ڕۆژی جەژن سەردەبڕدرێت[1].

و محمد ئەسیوبی دەڵێت: فەیومی دەڵێت: (ضَحی تضحیة) واتە: ئاژەڵی قوربانییەکەی لە کاتی چێشتەنگاودا سەربڕی، لە بنەڕەتدا بەمە گوتراوە، پاشان بەکارهێنراوە: بۆ ئەو کەسەی قوربانی سەردەبڕێت لە هەموو ڕۆژەکانی تەشریق، پاشان دەڵێت: قازی عیاز دەڵێت: پێیگوتراوە (أضحیة) چونکە لەکاتی (الضحی)دا ئاژەڵەکە سەردەبڕدرێت، کە بریتییە لە بەرزبوونەوەی خۆر[2].

و صەنعانی دەڵێت: (أضحیة) وەك ئەوەیە لە ناوی کاتەکەوە داڕێژرابێت، و شەرعییە لەو کاتەدا ئاژەڵی قوربانی

---

(١). لسان العرب (١٤/ ٤٧٦).
(٢). (ذخیرة العقبی)(٥/٥٤).

سەربڕدرێت، و هەر لەبەر ئەوەشە بە ڕۆژی جەژنی قوربان گوتراوە (یوم الأضحی)[٣].

و لە شەرعدا: قوربانی بریتییە لەو ئاژەڵەی "مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر، نێر یان مێ" کە لە دوای نوێژی جەژنی قوربانەوە سەردەبڕدرێت هەتاکو پێش ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن بە چەند مەرجێکی تایبەت، بەمەستی پەرستش و نزیکبوونە لە خوا ﷻ.

  

(٣). (سبل السلام)(٢/٥٢٩).

## شەرعییەتی سەربڕینی قوربانی

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢﴾(الكَوثَر).

واتە: نوێژ بە دڵسۆزییەوە بۆ پەروەردگارت بکە، و پەرستشی بۆ بکە بە سەربڕینی ئاژەڵ.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە زەحاکەوە ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: (﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢﴾، **صَلِّ لِرَبِّكَ الصَّلاةَ المَكْتُوبَةَ، وانْحَرْ واسْألْ بِنَحْرِكَ**).

واتە: نوێژە فەرزەکانت بۆ خوا بەجێبهێنە، و ئاژەڵی بۆ سەرببڕە، بەو سەربڕینە لێی بپاڕێرەوە؛ واتە: مەبەستت لە سەربڕینەکە پەرستش و نزیك بوونەوەبێت لە خوا ﷻ.

و تەبەری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: (﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢﴾، **الصَّلاةُ المَكْتُوبَةُ والذَّبْحُ يَوْمَ الأضْحى**).

واتە: بەجێهێنانی نوێژی فەرز، و سەربڕینی قوربانی لە ڕۆژی جەژنی قوربان.

و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: لێرە مەبەست هەموو نوێژەکانە، و یەکەم نوێژێك کە دەیگرێتەوە ئەو نوێژەیە کە پەیوەستە بە سەربڕینی ئاژەڵەوە، کە نوێژی جەژنی قوربانە[٤].

و ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢﴾ واتە: بەدڵسۆزییەوە نوێژە فەرزەکان و سوننەتەکانت بۆ خوا ئەنجام بدە، و بیپەرستە و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، و ئاژەڵ سەربڕە تەنها بە ناوی خواوە، وەك دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ۝١٦٣﴾(الأنعَامِ).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ: بە دڵنیاییەوە نوێژ و سەربڕینی ئاژەڵ و ژیان ومردنم بۆ خوای پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکانە، هیچ هاوبەشێکی نییە، و بەوە فەرمانم پێکراوە، و من یەکەم موسڵمانم لە ئوممەتەکەم، یان من یەکەم کەسم کە دان بەوەدا دەنێم و ملکەچ و گوێڕایەڵم لەم ئوممەتە بۆ پەروەردگارم کە هیچ هاوبەشی نییە.

---

(٤) . (تفسير جزء عم)(٣٣٣).

ئیبن عەباس رضي الله عنهما و عەتا و موجاهید و عیکرمە و حەسەن دەڵێن: مەبەست سەربڕینی هەدیی و هاوشێوەکانیەتی، و ئەمە بۆچوونی قەتادە و محمدی کوڕی کەعبی قورەزی وزەحاك و ڕەبیع و عەتای خوراسانی و حەکەم و ئیسماعیلی کوڕی ئەبوخالد و زیاتر لە زانایەکی تری سەلەفە، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە هاوبەشبڕیاردەران پەیڕەویان دەکرد و سوژدەیان بۆ جگە لە خوا دەبرد، و لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵەکان ناوی جگە لە خوایان دەهێنا، دوای ئەوەی چەند بۆچوونێك باس دەکات لەسەر: ﴿وَٱنۡحَرۡ﴾ دەڵێت: ئەو بۆچوونە پەسەندە کە مەبەست لە سەربڕین سەربڕینی ئاژەڵی قوربانییە، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی بەجێ دەهێنا و پاشان قوربانییەکەی سەردەبڕی و دەیفەرموو: ((مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلَا نُسُكَ لَهُ، فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نَيَّارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسكتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ، قَالَ: شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ، قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي عِنَاقًا هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ، أَفَتُجْزِئُ عَنِّي؟ قَالَ: تُجْزِئُكَ، وَلَا تُجْزِئُ أَحَدًا بَعْدَكَ))

أخرجه البخاري ومسلم.

واتە: هەرکەسێك نوێژەکەی وەك ئێمە بەجێ بهێنێت، و ئاژەڵەکەی وەك ئێمە سەربڕێت، ئەوە قوربانییەکەی شوێنی خۆی گرتووە، و هەرکەسێك پێش نوێژ ئاژەڵەکەی سەربڕیوە ئەوا قوربانی بۆ نییە، ئەبوبوردەی کوڕی نەیار هەستا، گوتی: من کاوڕەکەم پێش نوێژ سەربڕی، چونکە زانیم ئەمڕۆ ڕۆژێکە خەڵك حەز لە گۆشت دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاوڕەکەت کاوڕی گۆشتە، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا: گیسکێکم هەیە لە دوو کاوڕ لام خۆشەویستترە، ئایا دەشێت بیکەم بە قوربانی، فەرمووی: بۆ تۆ دەشێت، بەڵام بۆ کەسی تر دوای تۆ نابێت(٥).

و خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا ۗ وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾﴾(الحَجّ).

واتە: بۆ هەموو ئوممەتێك سەربڕین بە ناوی خوا و جەژنمان داناوە، بۆ ئەوەی ناوی خوا بهێنن لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵەکانی

(٥) . (تفسير القرآن العظيم)(٨/٥٠٢.٥٠٣).

مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر، پەرستراوی حەقی ئێوە تەنها یەك پەرستراوە کە خوایە، ملکەچی فەرمانەکانیبن، و ئەی پێغەمبەری خوا مژدەی چاکەی دونیا و قیامەت بدە بەو بەندە خاکییانەی کە ملکەچی پەروەردگاریانن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: سەربڕینی قوربانی و ڕشتنی خوێنی ئاژەڵان بە ناوی خواوە لە هەموو ئوممەتاندا شەرعی بووە، و ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ مانای ئەوەیە جەژنمان بۆ داناون، و عیکرمە دەڵێت: سەربڕینە، ﴿لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾، مەبەست ناوی خوا هێنانە لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵان، و بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((**كانَ النبيُّ ﷺ يُضحِّي بِكَبشينِ أملَحينِ أقرَنَيْنِ، ويُسمِّي، ويُكَبِّرُ، ولقد رأيتُهُ يذبَحُ بيدِهِ واضِعًا قدمَهُ على صفاحِهِما**)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخداری ڕەنگی سپی تێکەڵ بە ڕەشی دەکرد بە قوربانی، و"بسم الله، الله أكبر"ی

خوێند، و بینیم بە دەستی خۆی سەری دەبڕی و پێی خستە سەرلاتەنیشتی ملیان.

و بوخاری و مسلم لە عوقبەی کوڕی عامرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((أعطاني رَسولُ اللّهِ ﷺ غَنَمًا أقسِّمُها ضحايا، فبقي عَتُودٌ منها، فَذَكَرَهُ للنبيِّ ﷺ فَقالَ: ضَحِّ به أَنْتَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك مەڕ و بزنی پێدام دابەشی بکەم بەسەر هاوەڵاندا بیکەن بە قوربانی، گیسکێکی یەك ساڵان مایەوە، باسی ئەوەم کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: تۆ بیکە بە قوربانی[٦].

و ئیبن قودامە دەڵێت: موسڵمانان کۆڕان کە قوربانیکردن کارێکی شەرعییە[٧]؛ و ئیبن حجر دەڵێت: هیچ ناکۆکییەك نییە کە قوربانی لە دروشمەکانی ئاینە[٨].




(٦). بروانە : (تفسير القرآن العظيم)(٤٢٤/٥).
(٧). (المغني)(٣٤٥/٩).
(٨). (فتح الباري)(١٠/٣).

## حوکمی قوربانی

زانایان ناکۆکن دەربارەی حوکمی قوربانی و دوو بۆچوونیان هەیە لەو بارەیەوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی دارا ئاژەڵێك بۆ خۆی و خێزانەکەی بکات بە قوربانی، ئەمە بۆچوونی سەوری و ئەوزاعی و لەیس و ئەبوحەنیفە و ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدەوە و هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە و بۆچوونی ئەلبانییە، و ئەم ئایەت و فەرموودانە دەکەن بە بەڵگە:

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢﴾(الكَوثَر).

واتە: نوێژ بە دڵسۆزییەوە بۆ پەروەردگارت بەجێ بهێنە، و پەرستشی بۆ بکە بە سەربڕینی ئاژەڵ.

ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی ونەسائی و ئیبن ماجە لە میخنەفی کوڕی سولەیمەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((**كُنّا وُقوفًا مع النبيِّ ﷺ في عَرَفاتٍ فَسَمِعْتُهُ يقولُ: يا أيُّها الناسُ عَلى كلِّ أهلِ بَيْتٍ في كلِّ عامٍ أُضْحِيَّةٌ**)).

واتە: لە عەرەفات لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ وەستابووین گوێم لێ بوو، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە لە سەر هەموو خێزانێك هەموو ساڵێك قوربانی پێویستە.

و ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((**من كان له سَعَةٌ ولم يُضَحِّ فلا يَقرَبَنَّ مُصَلّانا**)).

واتە: هەرکەسێك دەوڵەمەند ودارابێت وقوربانی نەکات، نزیکی نوێژگەکەمان نەکەوێتەوە.

و بوخاری و مسلم لە جوندبی کوڕی عبداللەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((**صَلّى النبيُّ ﷺ يومَ النَّحْرِ، ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ ذَبَحَ، فَقالَ: مَن ذَبَحَ قَبْلَ أنْ يُصَلِّيَ، فَلْيَذْبَحْ أُخْرى مَكانَها، ومَن لَمْ يَذْبَحْ، فَلْيَذْبَحْ باسْمِ اللَّهِ**)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی قوربانی کرد، پاشان گوتاری خوێندەوە، پاشان قوربانی سەربڕی، فەرمووی: هەرکەسێك ئاژەڵەکەی پێش ئەوەی نوێژەکەی بەجێ بهێنێت

سەربڕیوە، ئاژەڵێکی تر لە جێگای سەربڕێت، و هەرکەسێك سەری نەبڕیوە سەری ببڕێت بە ناوی خواوە.

بەڵام جمهوری زانایان دەڵێن: قوربانی سوننەتێکە جەختلێکراوە، ئەمە بۆچوونی شافعییەکانە و ئەمە باوە لە مالك و ئەحمەدەوە، و بۆچوونی ئیسحاق و موزەنی و ئیبن مونزر و داود و ئیبن حەزم و ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و محمد ئەسیوبییە، و ئەم فەرموودە و ئەسەرانە دەکەن بە بەڵگە:

مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**مَن كانَ له ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ فإذا أُهِلَّ هِلالُ ذِي الحِجَّةِ، فلا يَأْخُذَنَّ مِن شَعْرِهِ، ولا مِن أظْفارِهِ شيئًا حتّى يُضَحِّيَ**))، **وفي رواية لمسلم وابن ماجه واللفظ له وصححه الألباني قال:** ((**إذا دخلَ العَشرُ وأرادَ أحدُكم أن يضحِّيَ فلا يمسَّ من شعرِه ولا بَشَرِهِ شيئًا**)).

واتە: هەرکەسێك ئاژەڵی هەبوو ویستی بۆ قوربانی سەری ببڕێت، ئەگەر مانگی حاجییان دەرکەوت، هیچ لە قژ و مووی لاشەی و نینۆکی نەگرێت، و لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:

ئەگەر گەیشتن بە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی حاجییان و کەسێکتان ویستی قوربانی بکات با لە قژ و مووی لاشەی و پێستی نەگرێت.

دەڵێن: ((**وأرادَ أحدُكم أن يضحِّيَ**)) ئەم دەربڕینە سەرپشککردنی موسڵمانە ئەگەر ویستی قوربانی بکات، ئەلبانی دەڵێت: ئەم گومانە هیچ بەهایەکی نییە لە ڕوانگەی دەقە شەرعییەکانەوە، ئێمە دەڵێین: سەرپشك کردنی مرۆڤ بە ویستی خۆیان، مەبەست ئەوەیە ئەگەر خۆی نەیەوێت خوا ﷻ بەزۆر پێی ئەنجام نادات، خوا ﷻ لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ٢٨﴾(التَّكۡوِير)، بەو تێگەیشتنە بێت دامەزران لەسەر ئاین واجب نییە چونکە خوا ﷻ مرۆڤەکانی سەرپشککردووە، و پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**مَن أرادَ الحجَّ فليعجِّلْ**))، حەج یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە حەج واجب نییە[٩].

---

(٩). (دروس للشيخ الألباني)(٦/٤٠).

و بەیهەقی لە ئەبو سەریحەی غەفارییەوە ﵁ ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (ما أدركت أبا بكر ، أو رأيت أبا بكر وعمر ﵄ كانا لا يضحيان . في بعض حديثهم . كراهية أن يقتدى بهما).

واتە: ئەبوبەکر و عومەرم ﵄ بینی قوربانییان نەدەکرد، لە ترسی ئەوەی خەڵك بە واجبی بزانێت.

دیسان بەیهەقی لە ئەبومەسعودی ئەنصارییەوە ﵁ ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (إني لأدع الأضحى ، وإني لموسر ، مخافة أن يرى جيراني أنه حتم علي).

واتە: من قوربانی ناکەم لە کاتێکدا دەوڵەمەندم، لە ترسی ئەوەی دراوسێکانم واببینن کە واجبە لەسەرم.

وبوخاری لە "بَابُ سُنَّةِ الأُضْحِيَّةِ"دا دەڵێت: ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: (هِيَ سُنَّةٌ وَمَعْرُوفٌ).

واتە: بابەتی سوننەتی قوربانی، ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: ئەمە سوننەتە و چاکەکارییە.

و بەیهەقی لە (السنن الكبرى) لە "كتاب الضحايا، باب الأضحية سنة يجب لزومها ويكره تركها" لە ئەبوخەصیبەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: قال ابن عمر رضي الله عنهما: (**لعلك تحسب حتمًا؟ قلت: لا ، ولكنه أجر وخير وسنة قال: نعم**).

واتە: کتێبی قوربانی، بابەتی قوربانی سوننەتە و پێویستە ئەنجام بدرێت و مەکروهە وازی لێبهێنرێت، ئیبن عومەر رضي الله عنهما بە ئەبوخەصیب دەڵێت: لەوانەیە قوربانیکردن بە واجب بزانیت؟ گوتم: نەخێر، بەڵکو خێر وچاکەیە و سوننەتە، گوتی: بەڵێ.

و ترمزی دەڵێت: کردار لەسەر ئەوەیە لای ئەهلی زانست کە قوربانی واجب نییە[10]؛ و ئیبن عوسەیمین دوای ئەوەی باسی بەڵگەی هەردوو بۆچوونەکە دەکات، دەڵێت: ئەمە بۆچوونی زانایان و بەڵگەکانیانە باسمانکردن بۆ ئەوەی بابەتی قوربانی و گرنگی لە ئایندا ڕوون ببێتەوە، و بەڵگەکانی هەردوولا نزیکە لەوەی هاوتابن، بەڵام

---

(١٠). (سنن الترمذي)(٩٢/٤).

باشتروایە کەسی دەوڵەمەند وازی لێنەهێنێت، لەبەر بە گەورە دانانی یادی خوا و دڵنیابوون لە ئەستۆ پاکی[١١].

به تێڕوانین و تێڕامان لە بەڵگەی ئەو زانایانەی قوربانیکردن بە واجب دەزانن، و ئەو زانایانەی بە سوننەتی جەخت لێکراوی دەزانن، دەبینیت بەڵگەکانی ئەو زانایانە بە هێزترە کە بە واجبی دەزانن، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانی دارا و دەوڵەمەند واز لە بەجێهێنانی ئەم دروشمە گەورەیە نەهێنێت.

  

(١١). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢١٩).

## فەزڵی قوربانیكردن

هیچ كەس لە زانایانی ئیسلام ناكۆكنین لەسەر شەرعییەتی قوربانی، و ئیبن تەیمییە دەڵێت: قوربانیكردن یەكێكە لە گەورەترین دروشمەكانی ئیسلام[١٢]؛ بەڵام ئیبن العربی دەڵێت: دەربارەی فەزڵی قوربانی هیچ فەرموودەیەكی صەحیح نییە، و خەڵك شتی سەرسوڕهێنەر لەوبارەیەوە دەگێڕنەوە[١٣]؛ و زۆرێك لە زانایان ئەم گوتەی ئیبن العەرەبییان گێڕاوەتەوە و دانیانپیێداناوە، وەك ئیبن حەجەر و سەخاوی و موناوی.

  

---

(١٢). (مجموع الفتاوى)(١٦٢/٢٣).
(١٣). (عارضة الأحوذي)(٢٨٨/٦).

## سەربڕینی ئاژەڵ لە هەموو ئوممەتاندا شەرعی بووە

ئەحمەد و ئەبوداود و ئیبن ماجە لە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما ریوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((ذبحَ النَّبيُّ ﷺ يومَ الذَّبحِ كبشينِ أملَحَينِ أقرَنَينِ مَوجوءَينِ فلمّا ذَبَحهما قالَ: إنِّي وجَّهتُ وجْهيَ للَّذي فطرَ السَّماواتِ والأرضَ، على ملَّةِ إبراهيمَ حَنيفًا وما أنا منَ المشرِكينَ، إنَّ صَلاتي ونُسُكي ومَحيايَ ومَماتي للهِ ربِّ العالمينَ، لا شريكَ لَهُ وبذلِكَ أمرتُ وأنا مِنَ المسلِمينَ، اللَّهمَّ منْكَ ولَكَ عن محمَّدٍ وأمَّتِهِ، بسمِ اللهِ واللهُ أكبرُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی جەژنی قوربان دوو بەرانی شاخداری ڕەنگ سپی تێکەڵ بە ڕەشی خەساوی کرد بە قوربانی، کاتێك سەریبڕین فەرمووی: ((إنِّي وجَّهتُ وجْهيَ للَّذي فطرَ السَّماواتِ والأرضَ على ملَّةِ إبراهيمَ حَنيفًا وما أنا منَ المشرِكينَ إنَّ صَلاتي ونُسُكي ومَحيايَ ومَماتي للهِ ربِّ العالمينَ لا شريكَ لَهُ وبذلِكَ أمرتُ وأنا مِنَ المسلِمينَ))، پەروەردگارا ئەمە تۆ پێت بەخشیوین، و لەبەر تۆ دەیکەین بە قوربانی، بۆ محمد وئوممەتەکەی: ((بسمِ اللهِ واللهُ أكبرُ)).

وخوا سبحانه وتعالى دەفەرمویت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾﴾(الحَجّ).

واتە: بۆ هەموو ئوممەتێك سەربڕین بە ناوی خوا و جەژنمان داناوە، بۆ ئەوەی ناوی خوا بهێنن لـە کاتی سەربڕینی ئاژەڵەکانی مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر، پەرستراوی حەقی ئێوە تەنها یەك پەرستراوە کە خوایە، ملکەچی فەرمانەکانیبن، و ئەی پێغەمبەری خوا مژدەی چاکەی دونیا و قیامەت بدە بەو بەندە خاکییانەی کە ملکەچی پەروەردگاریانن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: سەربڕینی قوربانی و ڕشتنی خوێنی ئاژەڵان بە ناوی خواوە لـە هەموو ئوممەتاندا شەرعی بووە، ئیبن عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ مانای ئەوەیە جەژنمان بۆ داناون، و عیکرمە دەڵێت: سەربڕینە، ﴿لِّيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾، مەبەست ناوی خوا هێنانە لـە کاتی سەربڕینی ئاژەڵان، بوخاری و مسلم لـە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: دوو بەرانی شاخداری ڕەنگی سپی تێکەڵ بە ڕەشیان هێنا، و"بسم الله، الله أكبر"ی خوێند، و پێی خستە سەرلا تەنیشتی ملیان، و سەریبڕین[١٤].



---

(١٤). بروانە : (تفسير القرآن العظيم)(٥/٤٢٤).

## قوربانی بەچی ئاژەڵێک دەکرێت

قوربانی بە حوشتر و مانگا و مەڕ و بزن "نێربن یان مێ" دەکرێت، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ٢٨﴾(الحَجّ).

ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ﴾، مانای حوشتر و مانگا و مەڕ و بزنە، وەك چۆن خوا ﷻ لە سورەتی ئەنعامدا بە درێژی باسیکردووە: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ ١٤٣﴾(الأَنعَام)[١٥].

و بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كانَ النبيُّ ﷺ يُضحِّي بِكَبشينِ أملَحينِ أقرَنَيْنِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانیدەکرد بە دوو بەرانی ڕەنگ سپی ڕەشباوی شاخدار.

(١٥). (تفسير القرآن العظيم)(٥/٤١٦).

و بوخاری و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((ضَحّى رَسولُ اللَّهِ ﷺ عن أزواجِهِ بالبَقَرِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە مانگا قوربانی کرد بۆ هاوسەرەکانی.

و ترمزی لە ئیبن عەباسەوە ﵄ ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كنا مع رسولِ اللهِ ﷺ في سَفَرٍ، فحَضَرَ الأَضْحى، فاشتَرَكْنا في البقرةِ سَبْعَةً، وفي البَعِيرِ عَشَرَةً)).

واتە: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین ﷺ جەژنی قوربانمان بەسەردا هات، حەوت کەس لە مانگادا بەشداربووین، و دە کەس لە حوشتر بەشداربوون.




## تەمەنی قوربانی

زانایان دەڵێن: شەریعەت تەمەنی قوربانی دیاریکردووە، ئەگەر لەو تەمەنە بچووکتربێت نابێت بکرێتە قوربانی، بوخاری و مسلم لە بەرائی کوڕی عازبەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلَا نُسُكَ لَهُ، فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نَيَّارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسكتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ، قَالَ: شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ، قَالَ: فَإِنَّ عِنْدِي عِنَاقًا هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ، أَفَتُجْزِئُ عَنِّي؟ قَالَ: تُجْزِئُكَ، وَلَا تُجَزِئُ أَحَدًا بَعْدَكَ)).

واتە: هەرکەسێك نوێژەکەی وەك ئێمە بەجێ بهێنێت، و ئاژەڵەکەی وەك ئێمە سەرببڕێت، ئەوە قوربانییەکەی شوێنی خۆی گرتووە، و هەرکەسێك پێش نوێژ ئاژەڵەکەی سەربڕیوە ئەوا قوربانی بۆ نییە، ئەبوبوردەی کوڕی نەیار هەستا، گوتی: من کاوڕەکەم پێش نوێژ سەربڕی، چونکە زانیم ئەمڕۆ ڕۆژێکە خەڵك حەز لە گۆشت دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کاوڕەکەت کاوڕی گۆشتە، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا:

گێسکێکم هەیە لە دوو کاورِ لام خۆشەویستترە، ئایا دەشێت بیکەم بە قوربانی، فەرمووی: بۆ تۆ دەشێت، بەڵام بۆ کەسی تر دوای تۆ نابێت.

و نەسائی لە عوقبەی کورِی عامرەوە رضي الله عنه رِیوایەتیکردووە دەڵێت: ((ضَحَّيْنَا مَعَ رَسُول اللَّه ﷺ بِجِذَعٍ مِنْ الضَّأْن)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرخێکی تەمەن شەش مانگمان کرد بە قوربانی.

و ئەبوداود لە کلیب کورِی شیهابی مەخزومییەوە رِیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((كنَّا مع رجلٍ من أصحابِ النَّبيِّ ﷺ يقالُ لَه: مُجاشع من بني سُليمٍ فعزَّتِ الغنَمُ، فأمرَ مناديًا فنادى أنَّ رسولَ ﷺ كانَ يقولُ: إنَّ الجذَعَ يوفِّي مِمَّا يوفِّي منْهُ الثَّنِيُّ)).

واتە: لەگەڵ هاوەڵێکی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین ناوی موجاشع بوو لە بەنوسلیم، مەرِ کەم بوو، فەرمانی کرد بە کەسێك بانگەواز بکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

بەرخ تەمەنی شەش مانگی تەواو کردبێت دروستە لە بری بزنێك یەك ساڵی تەواو کردبێت بکرێتە قوربانی.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: "الثني" لە حوشتر تەمەنی پێنج ساڵە، و لە مانگا تەمەنی دوو ساڵە، و لە مەڕ و بزن تەمەنی یەك ساڵە، "الجذع" تەمەنی شەش مانگە، قوربانیکردن دروست نییە بە حوشتر تەمەنی پێنج ساڵ کەمتر بێت، و مانگا لە دوو ساڵ کەمتر بێت، و بزن لە یەك ساڵ کەمتر بێت، و مەڕیش دەبێت تەمەنی لە شەش مانگ کەمتر نەبێت[١٦].

و لیژنەی هەمیشەیی فەتوا دەڵێن: بەڵگە شەرعییەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی ڕەگەزی مەڕ تەمەنی شەش مانگ بێت دروستە بۆ قوربانی، و بزن تەمەنی یەك ساڵ بێت، و مانگا تەمەنی دوو ساڵ بێت، و حوشتر تەمەنی پێنج ساڵ بێت، و ئەوەی تەمەنی لەوە کەمتر بێت دروست نییە نەلە هەدی نەلە قوربانی[١٧].

---

(١٦) . (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٣٧).
(١٧). (فتاوى اللجنة الدائمة-١)(٣٧٧/١١).

و ئیبن عبدالبر دەڵێت: هیچ ناکۆکییەك نازانم کە "الجذع" لە بزن و ئاژەڵەکانی تریش ناکرێت بە قوربانی، بەڵام لە ڕەگەزی مێ دەکرێت بە قوربانی(١٨).

و ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەوەی بۆچوونی جمهوری زانایانە "الثني" لە حوشتر و مانگا و بزن دەشێت بۆ قوربانی، و لە مەڕیش "الجذع"، "الثني" لە حوشتردا پێنج ساڵی تەواوکردووە، و لە مانگا دوو ساڵی تەواو کردووە، و گوتراوە: سێ ساڵی تەواوکردووە، و لە بزن دوو ساڵ بێت، و"الجذع" لە مەڕ گوتراوە، تەمەنی ساڵێك بێت، و گوتراوە: دە مانگ بێت، و گوتراوە: هەشت مانگ بێت، و گوتراوە: شەش مانگ، ئەمە کەمترین تەمەنە دەربارەی گوتراوە(١٩).

و ئەلبانی دەڵێت: لە مەڕدا "الجذع" ئەو ئاژەڵەیە تەمەنی گەیشتبێتە شەش مانگ، و هەندێکیان ناکۆکن دەڵێن: دەبێت ساڵێکی تەواو کردبێت، و هەندێکی تریان دەڵێن: جیاوازە و

(١٨) . (التمهيد)(١٨٨/٢٣).
(١٩). (تفسير القرآن العظيم)(٤٣٣/٥).

بەگوێرەی قەڵەوی و گۆشتنی ئاژەڵەكە دەگۆڕێت، ئەگەر قەڵەو و گۆشتن بێت تەمەنی شەش مانگ بێت ئاساییە، و ئەگەر وانەبێت تەمەنی دەبێت ساڵێك بێت، ئەو باسە ناكۆكی لەسەرە و گرنگ ئەوەیە مرۆڤ پارێزی بكات لەبەر ئاینەكەی، و ئاژەڵێك سەرببڕێت تەمەنی ساڵێك بێت؛ دیسان دەڵێت: باوەڕم وایە نابێت تەمەنی قوربانی لە شەش مانگ كەمتربێت، چونكە ئەوە كەمترین تەمەنە بۆ تەمەنی قوربانی باسكراوە، و گوتراوە: پێویستە ساڵێكی تەواو كردبێت[٢٠].

  

---

(٢٠). (مادة صوتية).

## كاتی سەربڕینی قوربانی

كاتی سەربڕینی قوربانی لە دوای نوێژی جەژنەوە دەست پێدەكات، هەتاكو پێش ئاوابوونی خۆری كۆتا ڕۆژی تەشریق، كە دەكاتە سیازدەیەمی مانگی حاجییان، بوخاری و مسلم لە بەرائی كوڕی عازبەوە ﵄ ڕیوایەتیانكردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا، فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ فَلَا نُسُكَ لَهُ)).

واتە: هەركەسێك نوێژەكەی وەك ئێمە بەجێ بهێنێت، و ئاژەڵەكەی وەك ئێمە سەربڕێت، ئەوە قوربانییەكەی شوێنی خۆی گرتووە، و هەركەسێك پێش نوێژ ئاژەڵەكەی سەربڕیوە ئەوا قوربانی بۆ نییە.

باشتر وایە دوای تەواوبوونی گوتاری ڕۆژی جەژن ئاژەڵی قوربانی سەربڕدرێت، بوخاری و مسلم لە جوندبی كوڕی عبداللەوە ﵁ ڕیوایەتیانكردووە دەڵێت: ((صَلّى النبيُّ ﷺ يَومَ النَّحْرِ، ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ ذَبَحَ، فَقالَ: مَن ذَبَحَ قَبْلَ أنْ يُصَلِّيَ، فَلْيَذْبَحْ أُخْرى مَكانَها، ومَن لَمْ يَذْبَحْ، فَلْيَذْبَحْ باسْمِ اللَّهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەژنی قوربانی کرد، پاشان گوتاری خوێندەوە، پاشان قوربانی سەربڕی، فەرمووی: هەرکەسێك ئاژەڵەکەی پێش ئەوەی نوێژەکەی بەجێ بهێنێت سەربڕیوە، ئاژەڵێکی تر لە جێگای سەرببڕێت، و هەرکەسێك سەری نەبڕیوە سەری ببڕێت بە ناوی خواوە.

و ئەو فەرموودەی کە مسلم لە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((صَلّى بنا النبيُّ ﷺ يَومَ النَّحْرِ بالمَدِينَةِ، فَتَقَدَّمَ رِجالٌ فَنَحَرُوا، وَظَنُّوا أنَّ النبيَّ ﷺ قدْ نَحَرَ، فأمَرَ النبيُّ ﷺ مَن كانَ نَحَرَ قَبْلَهُ أَنْ يُعِيدَ بنَحْرٍ آخَرَ، وَلا يَنْحَرُوا حتّى يَنْحَرَ النبيُّ ﷺ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە نوێژی جەژنی قوربانی بۆ کردین، کەسانێك پەلەیان کرد قوربانییەکەیان سەربڕی، گومانیان وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانییەکەی سەربڕیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد هەرکەسێك پێش ئەو قوربانییەکەی سەربڕیوە قوربانییەکی تر سەرببڕێت، و سەری نەبڕن هەتاکو پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانییەکەی سەردەبڕێت.

نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە مالك دەیکاتە بەڵگە کە قوربانی دروست نییە دوای سەربڕینی قوربانی ئیمام نەبێت، و جمهوری زانایان دەڵێن: مەبەستی ڕێگریکردنە لە پەلەکردن کە لەوانەیە پێش کاتەکەی قوربانی سەرببڕن، لەبەر ئەوە فەرموودەکانی تر وابەستەی کردووە بە نوێژەوە، و هەرکەسێك دوای بەجێهێنانی نوێژ قوربانی بکات دروستە[٢١].

و باشتروایە لە نوێژگە ئاژەڵی قوربانی سەرببڕدرێت، بوخاری لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يَنْحَرُ، أوْ يَذْبَحُ بالمُصَلّى)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵی قوربانییەکەی لە نوێژگە سەردەبڕی.

و باشترە لە یەکەم ڕۆژی جەژندا ئاژەڵی قوربانی سەربدرێت لەبەر ئەوەی کۆتا ڕۆژە کە کردەوەی باش تیایدا لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵ باشترە، بوخاری لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما

---

(٢١). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١١٨/١٣).

ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**مَا العَمَلُ فِي أَيَّامٍ أَفْضَلَ مِنْهَا فِي هَذِهِ؟، قَالُوا: وَلاَ الجِهَادُ؟ قَالَ: وَلاَ الجِهَادُ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ**)).

واتە: لە هیچ ڕۆژێکدا ئەنجامدانی کردەوە پاداشتی باشتر نییە لە ئەنجامدانی لەم ڕۆژانە "دە ڕۆژی سەرەتای مانگی حاجییان"، گوتیان: جیهاد و تێکۆشانیش، فەرمووی: جیهاد و تێکۆشانیش، ئیللا کەسێك بە ماڵ و نەفسی تیابچێت و نەگەڕێتەوە.

و ئەگەر لە شوێنێك یان لە گوندێك نوێژی جەژن ئەنجام نەدرا، سەرەتای کاتی قوربانی دوای هەڵهاتنی خۆری ڕۆژی جەژنی قوربانە بە ئەندازەی کاتی بەجێهێنانی نوێژ و خوێندنی گوتارەکە چاوەڕوان دەکرێت پاشان قوربانی سەردەبڕن، ئیبن قودامە دەڵێت: جگە لە خەڵکی شارەکان سەرەتای کاتی قوربانیکردن، بریتییە لە تێپەڕبوونی ئەندازەی کاتی نوێژ و خوێندنی گوتارەکەی[٢٢].

(٢٢). (المغني)(٩/٤٥٢).

و كۆتا كاتی سەربڕینی قوربانی پێش ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، كە كۆتا ڕۆژی تەشریقە، و دەكاتە سیازدەیەمی مانگی حاجییان، كەواتە لە دوای نوێژی جەژنەوە هەتاكو ئاوابوونی خۆری چوارەم ڕۆژی جەژن موسڵمان دەتوانێت قوربانییەكەی سەربڕێت، ئەحمەد و ئیبن حبان و بەیهەقی لە جوبەیری كوڕی موتعمەوە ﵁ ڕیوایەتیانكردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((**كلُّ أيّامِ التَّشريقِ ذبحٌ**)).

واتە: هەموو ڕۆژەكانی تەشریق كاتی سەربڕینی قوربانییە.

**محمد** ئەسیوبی دەڵێت: (أيّامِ التَّشريقِ) مەبەست ڕۆژەكانی دوای جەژنی قوربانە، ناونراوە (التشريق) لەبەر ئەوەی گۆشتی قوربانی هەڵدەخرێت و خۆر لێی دەدات، و گوتراوە: لەبەر ئەوەیە قوربانی سەرنابڕدرێت هەتاكو خۆرهەڵنەیەت[٢٣].

---

**(٢٣). (البحر المحيط الثجاج)(٢٦٢/٢١).**

و زانایان ناکۆکن دەربارەی سەربڕینی قوربانی بە شەو، ئەوەی دەڵێت: جمهوری زانایان دەڵێن: دروستە لەگەڵ کەراهەتدا، و مالك و ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە دەڵێن: دروست نییە بەشەو قوربانی سەربڕدرێت[٢٤]؛ و شەوکانی دەڵێت: ئەو بۆچوونەی دەڵێت: قوربانی مەکروهە یان دروست نییە بە شەو پێویستی بە بەڵگەیە[٢٥]؛ و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: دروستە و مەکروهـ نییە[٢٦].

  

---

(٢٤). بروانة (المجموع)(٣٩١/٨).
(٢٥). (نيل الأوطار)(١٢٦/٥).
(٢٦). (الشرح الممتع)(٤٦/٧).

## مەرجەکانی دروستی قوربانی

وەك زانراوە هەموو پەرستشێك بۆ ئەوەی وەربگیرێت بە شێوەیەکی گشتی دوو مەرجی هەیە:

یەکەم: دڵسۆزی (الإخلاص) واتە: بە تەنها ئەنجامی کردەوە لەبەر بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بێت، دوور لە ڕیا وڕووپامایی.

دووەم: (متابعە): ئەنجامدانی بەوشێوەیەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، بەبێ کەم وزیاد و داهێنان تیایدا.

بەڵام کردەوەکان هەندێك مەرج و پێویستی تایبەتیان هەیە بۆ قەبوڵبوونیان پێویستە ئەو مەرجانەیان تێدا بەدی بێت، و لە قوربانیکردندا پێویستە ئەم مەرجانە ڕەچاو بکرێت:

یەکەم: پێویستە لە ئاژەڵەکانی حوشتر یان مانگا یان مەڕ و بزن بێت، و قوربانی بەهیچ جۆرە ئاژەڵێکی تر ناکرێت.

دووەم: پێویستە لەو کاتەدا سەر ببڕدرێت کە لە شەریعەتدا دیاریکراوە، کە لە دوای بەجیهێنانی نوێژی جەژنی قوربانەوە

دەست پێدەکات، و بە ئاوابوونی خۆری سیازدەیەمی مانگی حاجییان کە چوارەم ڕۆژی جەژنە کۆتایی دێت.

سێیەم: پێویستە هەریەکە لەو ئاژەڵانە ئەو تەمەنەیان کردبێت کە لە شەریعەتدا هاتووە، و قوربانیکردن بە ئاژەڵێك تەمەنی لەو تەمەنە دیاریکراوانە کەمتربێت بۆ قوربانی دروست نییە.

چوارەم: پێویستە سەلامەت بێت لەو کەموکورتیانەی کە لە شەریعەتدا دیاریکراوە.

پێنجەم: پێویستە ئاژەڵەکە موڵکی ئەو کەسەبێت.

شەشەم: ئەو ئاژەڵە مافی کەسی تری لەسەر نەبێت، ئەگەر ئاژەڵێك بارمتەبێت نابێت بکرێتە قوربانی، ئەمە بۆچوونی ئیبن عوسەیمینە[٢٧].

  

(٢٧). بروانه (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٨٠).

## ئەو کەموکورتیانەی نابێت

## لە ئاژەڵی قوربانیدا هەبێت

ئاژەڵی قوربانی باشتروایە ئاژەڵێکی قەڵەوی گۆشتن بێت و لە هەموو کەموکورتییەك بە دووربێت، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ٣٢﴾(الحَجّ)، ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ مەبەست بە گەورە زانینی فەرمانەکانی خوایە، ئەوە لە پارێزکار و ترسی خوایە لە دڵەکاندا، و لەو دروشمانە قەڵەوکردنی ئاژەڵ و حوشتری هەدییە، ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ﴿ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ مانای قەڵەوکردن و گەورەکردن و هەڵبژاردنی ئاژەڵی باشە[٢٨]؛ و بوخاری لە ئەبوئومامەی کوڕی سەهلەوە بە موعەلەقی ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((**كُنَّا نُسَمِّنُ الْأُضْحِيَّةَ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُسمّنون**)).

---

(٢٨). بروانە (تفسیر القرآن العظیم)(١٠/٢).

واتە: ئێمە قوربانیمان قەڵەو دەکرد لە مەدینە، و موسڵمانانیش ئەو کارەیان دەکرد.

ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان لە بەرائی کوڕی عازبەوە رضي الله عنهما ریوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((أربعٌ لَا يُضَحَّى بِهِنَّ: الْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا ، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا ، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ظَلَعُها ، وَالْعَجْفَاءُ الَّتِي لَا تُنْقي)) ، فَقَالُوا لِلْبَرَاءِ: فَإِنَّمَا نَكْرَهُ النَّقْصَ فِي السِّنِّ والأُذُن والذَّنَبِ؟ قَالَ: فاكْرَهُوا مَا شِئْتُمْ ، وَلَا تُحَرِّموا عَلَى الناس.

واتە: چوار جۆر ئاژەڵ ناکرێت بە قوربانی، ئاژەڵێك چاوێکی کوێربێت و بە ئاشکرا دیاربێت، و ئاژەڵێکی نەخۆش کە بە ئاشکرا نەخۆشییەکەی دیاربێت، و ئاژەڵێکی شەل کە بە ئاشکرا پێوەی دیاربێت و دوا بکەوێت لە ڕۆیشتندا، و ئەو ئاژەڵەی لاوازبێت و ئێسقانی مۆخی تێدا نەبێت، گوتیان بە بەراء: ئێمە کەموکورتی لە ددان و گوێ و کلکی ئاژەڵان بە خراپ دەزانین، گوتی: چی بەخراپ دەزانن ویستی خۆتانە، بەڵام لەسەر خەڵك حەرامی مەکەن.

نەوەوی دەڵێت: قوربانیکردن بەو ئاژەڵەی عەیبی تێدایە و گۆشتی کەم دەکاتەوە دروست نییە، ئەگەر نەخۆشییەکەی کەم بوو نابێتە ڕێگر، بەڵام ئەگەر دیار بوو و بەهۆیەوە لاوازبوو و گۆشتەکەی خراپ بووبێت دروست نییە، ئەمە مەزهەبی شافعی و جمهوری زانایانە[٢٩].

و ئیبن عبدالبر دەڵێت: ئەو چوار عەیبەی کە لە فەرموودەکە باسکراوە زانایان کۆڕان کە بۆ قوربانی ناشێت، هیچ ناکۆکییەك لە نێوان زانایان نازانم لەوبارەیەوە[٣٠].

و نەوەوی دەڵێت: زانایان کۆڕان ئەو چوار عەیبەی لە فەرموودەی بەرائدا باسکراوە دروست نییە بکرێت بە قوربانی، هەروەها هەر عەیبەیەکی تر هاومانای ئەو عەیبانەبێت یان خراپتر، وەك کوێری و پەڕینی قاچ و هاوشێوەی[٣١].

---

(٢٩). (المجموع)(٨/٤٠٠).
(٣٠). (التمهيد)(٢٠/١٦٨).
(٣١). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١٣/١٢٠).

و خەتابی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە عەیبی کەم لە قوربانیدا ئاساییە، نابینی دەفەرموێت: چاوێکی کوێربێت بە ئاشکرا دیاربێت، و نەخۆشی بە ئاشکرا دیاربێت، و لاوازی دیاربێت، ئەو عەیبەی کەمە و بە ئاشکرا دیار نییە ئاساییە[٣٢].

و ئەبوداود و ترمزی و نەسائی لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە ﵁ ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((**أمرَنا رسولُ اللَّهِ ﷺ أن نستشرِفَ العينَ، والأُذُنَ**)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین دیقەتی چاو و گوێی قوربانی بدەین.

و خاوەن سوننەنەکان لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە ﵁ ڕیوایەتیانکردووە، ئەلبانی لە (إرواء الغليل)دا دەڵێت: "صحيح بمجموع طرقه"، دەڵێت: ((**نَهى رسولُ اللهِ ﷺ أنْ يُضحّى بأعضَبِ القَرْنِ**))، **قال قتادة: فذكرت ذلك لسعيد بن المسيب فقال: العضب النصف فأكثر من ذلك.**

---

**(٣٢). (معالم السنن)(٢/ ٢٣٠).**

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیکردووە ئاژەڵی شاخ شکاو بکرێتە قوربانی؛ قەتادە دەڵێت: ئەوەم باسکرد بۆ سەعیدی کوڕی موسەیب، گوتی: "العضب" نیوە یان زیاتری شاخی شکابێت.

ئیبن عبدالبر دەڵێت: هیچ ناکۆکییەك نازانم لە نێوان زانایان کە بڕانی هەموو گوێ یان زۆربەی عەیبەیە لە ئاژەڵدا و پێویستە نەکرێت بە قوربانی(٣٣).

و ئیبن قدامە دەڵێت: "العضب" بریتییە لەوەی ئاژەڵ نیوەی گوێی یان شاخی نەمابێت، کە ئەمەش ڕێگرە لە دروستی، ئەمە بۆچوونی نەخعی و ئەبویوسف و محمدە(٣٤).

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەو شتانە مەکروهن بکرێن بە قوربانی کە لە فەرموودەکاندا نەهی لەسەر هاتووە و عەیبە لە ئاژەڵی قوربانیدا یان فەرمانکراوە بە دوورکەوتنەوە لێی، بۆیە مەکروهە

---

(٣٣). (الاستذكار)(٢١٦/٥).
(٣٤). (المغني)(٤٤١/٩).

لەبەر کۆ کردنەوەیان لەگەڵ فەرموودەکەی بەرائی کوڕی عازب رضي الله عنهما.(٣٥)

کەواتە: لە فەرموودەکانی و لێکدانەوەی زانایانەوە ئەوەمان دەست دەکەوێت، ئەو چوار جۆرە ئاژەڵەی لە فەرموودەی بەرائی کوڕی عازبدا رضي الله عنهما هاتووە دروست نییە بکرێن بە قوربانی، و عەیب و کەموکورتییەکانی تر مەکروهن و باشتروایە نەکرێن بە قوربانی بەڵام ئەگەر کران بە قوربانی دروستە، و هەتا ئاژەڵێکی قەڵەوی گۆشتن و دوور لە هەموو کەم و کورتییەك بێت باشترە.

  

(٣٥). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٤٣).

## کام ڕەگەز باشترە

جهموری زانایان بۆچوونیان وایە کە حوشتر لە مانگا باشتر و مانگا لە مەڕ و بزن باشترە بکرێت بە قوربانی، و ئەم فەرموودەیە دەکەن بە بەڵگە، بوخاری و مسلم لە ئەبوزەری غەفارییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((يا رَسولَ اللّهِ، أيُّ الرِّقابِ أفْضَلُ؟ قالَ: أنْفَسُها عِنْدَ أهْلِها وأَكْثَرُها ثَمَنًا)).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا کام بەندە باشترینە ئازاد بکرێت، فەرمووی: ئەوەیان کە بە نرخترین و گران بەهاترینە لای خاوەنەکەیان.

و ئەم فەرموودەیە کە بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنِ اغْتَسَلَ يَومَ الجُمُعَةِ غُسْلَ الجَنابَةِ ثُمَّ راحَ، فَكَأنَّما قَرَّبَ بَدَنَةً، ومَن راحَ في السّاعَةِ الثّانِيَةِ، فَكَأنَّما قَرَّبَ بَقَرَةً، ومَن راحَ في السّاعَةِ الثّالِثَةِ، فَكَأنَّما قَرَّبَ كَبْشاً، أقْرَنَ)).

واتە: هەركەسێك ڕۆژى هەینى خۆى بشوات لە سەعاتى یەكەمدا بچێت بۆ مزگەوت، پاداشتى وەك ئەو كەسەیە حوشترێكى كردبێت بە قوربانى، و هەركەسێك لە سەعاتى دووەمدا بچێت وەك ئەو كەسەیە مانگایەكى كردبێت بە قوربانى، و هەركەسێك لە سەعاتى سێیەم بچێت وەك ئەو كەسەیە بەرانێكى شاخدارى كردبێت بە قوربانى.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: لە قوربانیدا باشترینیان حوشترە پاشان مانگا ئەگەر كەسێك بە تەواوى بیانكات بە قوربانى، پاشان مەڕ پاشان بزن، پاشان حەوتیەكى حوشتر پاشان حەوتیەكى مانگا(٣٦)؛ بەڵام مالك لە قوربانیدا بەرانى پێباشترە، بەڵگەى ئەم فەرموودەیە كە بوخارى ومسلم لە ئەنەسى كوڕى مالكەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانكردووە دەڵێت: ((ضحّى رسولُ اللهِ ﷺ بكبشين أملحين)).

واتە: پێغەمبەرى خوا ﷺ دوو بەرانى شاخدارى كرد بە قوربانى.

(٣٦). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٢٩).

و بەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرمویّت: ﴿وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ۝١٠٧﴾(الصَّافَّات).

واتە: ئیسماعیلمان ڕزگار کرد و لە بری بەرانێکی گەورەمان بەخشییە پێغەمبەر ئیبراهیم ؑ بیکات بە قوربانی.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەوەی کە پەسەندە و بۆچوونی زۆربەی زانایانە: فیدییەکەی بەرانێك بوو[٣٧]؛ و قورتبی دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە قوربانی بە ڕەگەزی مەڕ باشترە لە حوشتر و مانگا ئەوە مەزهەبی مالك و هاوەڵەکانییەتی، و دەڵێن: باشترین قوربانی بەرانە، پاشان مەڕ لە ساورین باشترە، و ساورین لە بزن باشترە، و بزن لە حوشتر و مانگا باشترە[٣٨].

و ئیبن عبدالبر دەڵێت: بەرانی شاخدار لە قوربانیدا باشترین جۆری قوربانییە لای مالك و زۆربەی زانایان[٣٩].

  

(٣٧). (تفسير القرآن العظيم)(٣١/٧).
(٣٨). (الجامع لأحكام القرآن)(١٠٧/١٥).
(٣٩). (الاستذكار)(٢٢٠/٥).

## سیفەت و ڕەنگی قوربانی

بوخاری و مسلم لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ﷺ ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كان يُضَحِّي بِكُبْشَيْنِ أقرنينِ أملحينِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی دەکرد بە دوو بەرانی شاخداری ڕەنگ سپی تێکەڵ بە ڕەش .

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە موسڵمان ئەگەر توانی بە دوو بەرانی شاخداری ڕەنگ سپی تێکەڵ بە ڕەش قوربانی بکات باشترە، ئیبن حەجەر دەڵێت: هەرکەسێك ئاژەڵێك سەربرِێت قوربانی لەسەر دەکەوێت، و هەرکەسێك زیاتر سەربرِێت باشە، و باشترین شێوە شوێنکەوتی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە قوربانی کردندا، کە دوو بەرانی سەربڕیوە[٤٠].

و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﷺ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بكَبْشٍ أَقْرَنَ يَطَأُ في سَوادٍ، وَيَبْرُكُ في سَوادٍ، وَيَنْظُرُ في سَوادٍ، فَأُتِيَ به لِيُضَحِّيَ به، فَقالَ لَها: يا عائِشَةُ، هَلُمِّي المُدْيَةَ، ثُمَّ قالَ: اشْحَذِيها بحَجَرٍ، فَفَعَلَتْ: ثُمَّ أَخَذَها، وَأَخَذَ الكَبْشَ فأضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قالَ: باسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِن مُحَمَّدٍ، وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ، ثُمَّ ضَحّى بهِ)).

---

(٤٠). (فتح الباري)(١٠/١٢).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەرانێکیان بۆ هێنا بۆ ئەوەی بیکات بە قوربانی، کە پێستی دەوری چاو و دەم و ئەژنۆ و پەلـەکانی ڕەش بوو، فەرمووی ئەی عائیشە: چەقۆم بۆ بهێنە، و بە بەردێك تیژی بکە، دوای ئەوەی چەقۆکەم تیژکرد، بەرانەکەی دابەزەویدا و فەرمووی: بەناوی خواوە، پەروەردگارا لـە محمد و ئالی محمد و ئوممەتی محمدی وەربگرە، پاشان سەریبڕی و کردی بە قوربانی.

و بوخاری و مسلـم لـە ئەنەسەوە ﷺ ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((**كانَ النبيُّ ﷺ يُضحِّي بِكَبشينِ أملَحينِ أقرَنَيْنِ، ويُسمِّي، ويُكَبِّرُ، ولقد رأيتُهُ يذبَحُ بيدِهِ واضِعًا قدمَهُ على صفاحِهِما**)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخ گەورەی ڕەنگ سپی تێکەڵ بە ڕەشی دەکرد بە قوربانی، "بسم الله، الله أكبر"ی خوێند، و بینیم بە دەستی خۆی سەری دەبڕی و پێی خستە سەرلاتەنیشتی ملیان.

و ئیبن ماجە لـە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیکردووە و ئەلـبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ اشْتَرَى كَبْشَيْنِ عَظِيمَيْنِ سَمِينَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ مَوْجُوءَيْنِ**

فَذَبَحَ أَحَدَهُمَا عَنْ أُمَّتِهِ لِمَنْ شَهِدَ لِلَّهِ بِالتَّوْحِيدِ وَشَهِدَ لَهُ بِالْبَلاغِ وَذَبَحَ الآخَرَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَعَنْ آلِ مُحَمَّدٍ ﷺ)).

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایه قوربانی بکات دوو بەرانی گەورەی قەڵەوی شاخداری ڕەنگ سپی ڕەشباوی خەساوی دەکڕی، یەکێکیانی بۆ ئوممەتەکەی کەوا گەواهی تاك و تەنها پەرستنی خوا، و گەواهی پێغەمبەرایەتیان بۆ داوە، و ئەوی تریانی بۆ محمد و ئالی محمد ﷺ سەردەبڕی.

ئەم فەرموودانه بەڵگەی ئەوەیان تێدایه سوننەته ئەو بەرانەی دەکرێت بە قوربانی چاو و دەم و ئەژنۆ وپەلەکانی ڕەش و ڕەنگی سپی مەیلەوڕەش و قەڵەو بێت، و چەقۆ تیژ بکرێت و پێ بخرێتە لای ملی، و ئەو زیکرانەی لەو فەرموودانه هاتووە بخوێندرێت، و((مَوجوءَینِ)) کە مانای خەساوە، دروستە ئاژەڵی خەساو بکرێت بە قوربانی، و شەوکانی دەڵێت: فەرموودەکانی ئەم بابەتە کراوەتە بەڵگە سوننەتە ئاژەڵی خەساو بکرێت بە قوربانی[٤١].

  

(٤١). (نيل الأوطار)(٥/١٤٢).

## قوربانیکردن بۆ خێزان

مەڕێك یان بزنێك دەکرێتە قوربانی بۆ خێزانێك، ئەگەرچی ژمارەشیان زۆربێت، ترمزی و ئیبن ماجە لە عەتای کوڕی یەسارەوە ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت:
((سألتُ أبا أيُّوبَ الأنصاريَّ: كيفَ كانَتِ الضَّحايا على عَهْدِ رسولِ اللهِ ق؟ فقالَ: كان الرَّجُلُ يُضحِّي بالشاةِ عنهُ، وعنْ أهلِ بيتِهِ، فيأكلونَ ويُطعِمونَ، حتّى تَباهى النّاسُ، فصارَتْ كَما تَرى)).

واتە: پرسیارم لە ئەبوئەیوبی ئەنصاری ﵁ کرد، لە سەردەمی ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانیکردن چۆن بوو، گوتی: پیاوێك مەڕێك یان بزنێکی دەکرد بە قوربانی بۆ خۆی، و ئەندامانی خێزانەکەی، لێیان دەخوارد، و بەشی خەڵکیان لێدەدا، بەڵام ئێستا دەبینی خەڵك شانازی بەوە دەکەن کە قوربانی زیاتر دەکەن.

و بوخاری لە عبداللەی کوڕی هیشامەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە کە: ((كان يضحِّي بالشّاةِ الواحدةِ عَن جميعِ أَهلِهِ)).

واتە: بە مەڕێك یان بزنێك قوربانی دەكرد بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکەی.

ئیبن قەیم دەڵێت: سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وابووە کە مەڕێك یان بزنێك بەسە بۆ کەسێك و خێزانەکەی ئەگەر ژمارەشیان زۆر بێت(٤٢)؛ و شەوکانی دەڵێت: ئەوەی کە حەقە مەڕێك یان بزنێك بەسە لە قوربانیکردندا بۆ خێزانێك، ئەگەر سەد کەس یان زیاتریشبن، وەك ئەوەی لە سوننەتدا هاتووە(٤٣)؛ و(لیژنەی هەمیشەیی فەتوا) دەڵێن: ئەگەر خێزانێك زۆربن و لە یەك ماڵدا بژین، یەك قوربانی بۆ هەموویان بەسە، و ئەگەر ئاژەڵێك زیاتر بکەن بە قوربانی باشترە(٤٤).

  

(٤٢). (زاد المعاد)(٢/٢٩٥).
(٤٣). (نيل الأوطار)(٥/١٤٣).
(٤٤). (فتاوى اللجنة الدائمة -١)(١١/٤٠٨).

## هاوبەشی کردن لە ئاژەڵی قوربانی

مەڕێك یان بزنێك بۆ خێزانێك دەکرێتە قوربانی، هەروەها دەتوانرێت حەوتیەکی مانگایەك یان دەیەکی حوشترێك بۆ خێزانێك بکرێتە قوربانی، ئەوەوی دەڵێت: قوربانی بە مەڕێك یان بزنێك بکرێت باشترە لە هاوبەشیکردن لە حەوتیەکی حوشترێك یان مانگایەك(٤٥)؛ و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: دروست نییە دوو کەس یان زیاتر لە مەڕێك یان بزنێك هاوبەشی بکەن بۆ قوربانیکردن(٤٦)؛ چونکە ئەوە لە سوننەتدا نەهاتووە، مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بكَبْشٍ أَقْرَنَ يَطَأُ في سَوادٍ، وَيَبْرُكُ في سَوادٍ، وَيَنْظُرُ في سَوادٍ، فَأُتِيَ به لِيُضَحِّيَ به، فَقالَ لَها: يا عائِشَةُ، هَلُمِّي المُدْيَةَ، ثُمَّ قالَ: اشْحَذِيها بحَجَرٍ، فَفَعَلَتْ: ثُمَّ أَخَذَها، وَأَخَذَ الكَبْشَ فأضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قالَ: باسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِن مُحَمَّدٍ، وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ، ثُمَّ ضَحّى بهِ)).

---

(٤٥). (المجموع)(٨/٣٩٥).
(٤٦). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٣١).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەرانێکیان بۆ هێنا بۆ ئەوەی بیکات بە قوربانی، کە پێستی دەوری چاو و دەم و ئەژنۆ و پەڵەکانی ڕەش بوو، فەرمووی ئەی عائیشە: چەقۆم بۆ بهێنە، و بە بەردێك تیژی بکە، دوای ئەوەی چەقۆکەم تیژ کرد، بەرانەکەی دابەزەویدا و فەرمووی: بەناوی خواوە، پەروەردگارا لە محمد و ئالی محمد و ئوممەتی محمدی وەربگرە، پاشان سەریبڕی و کردی بە قوربانی.

و ترمزی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صحیحی داناوە دەڵێت: ((**كنا مع رسولِ اللهِ ﷺ في سَفَرٍ، فحَضَر الأَضْحى، فاشتَرَكْنا في البقرةِ سَبْعَةً، وفي البَعِيرِ عَشَرَةً**)).

واتە: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین ﷺ جەژنی قوربانمان بەسەردا هات، حەوت کەس لە مانگادا بەشداربووین، و دە کەس لە حوشتر بەشداربوون.




## چەند پرسێکی هەمە جۆر

١. ئەو کەسەی قوربانی دەکات پێویستە لەسەری بە بینینی مانگی حاجییان یان تەواوکردنی سی ڕۆژی مانگی زوالقعدە، نینۆك و موو و قژ و پێستی نەگرێت، هەتاکو قوربانییەکەی سەردەبڕێت، مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن كانَ له ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ فإذا أُهِلَّ هِلالُ ذِي الحِجَّةِ، فلا يَأْخُذَنَّ مِن شَعْرِهِ، ولا مِن أظْفارِهِ شيئاً حتّى يُضَحِّيَ)) وفي رواية لمسلم وابن ماجه واللفظ له صححه الألباني قال: ((إذا دخلَ العَشرُ وأرادَ أحدُكم أن يضحِّيَ فلا يمسَّ من شعرِهِ ولا بَشَرِهِ شيئًا)).

واتە: هەرکەسێك ئاژەڵی هەبوو ویستی بۆ قوربانی سەری ببڕێت، ئەگەر مانگی حاجییان دەرکەوت، هیچ لە قژ و مووی لاشەی و نینۆکی نەگرێت، و لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئەگەر گەیشتن بە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی حاجییان و کەسێکتان ویستی قوربانی بکات با لە قژ و مووی لاشەی و پێستی نەگرێت.

ئەم حوکمە تایبەتە بەو کەسەی لە خێزانەکە قوربانییەکە دەکات، و ئەندامانی تری خێزانەکە ناگرێتەوە، کە پێکەوە دەژین، و ئەگەر ژیان و سامان و داراییان جیابێت پێویستە لەسەر هەموو خێزانەکان قوربانی بۆ خۆیان بکەن، بەڵام ئەگەر ناچاربوو قژی لا ببات یان نینۆکی شکا بۆ نموونە دەتوانێت لای ببات و هیچی لەسەر نییە و کاریگەری لەسەر قوربانییەکەی نابێت، و کەسێك ئەگەر لە بیری چوو لە نینۆك و پێست و قژ و مووی گرت، هیچی لەسەر نییە، و ئەگەر کەسێك لە سەرەتای مانگەوە پارەی بە دەستەوە نەبوو و نییەتی نەبوو قوربانی بکات، بەڵام دوای ئەوە قەرزیکرد یان پارەکەی دەستگیر بوو لەو کاتەوە کە بڕیار دەدات قوربانی بکات خۆی لەو شتانە دەگرێتەوە، و ئەگەر کەسێك بە ئەنقەست ئەو کردەوانەی ئەنجامدا و ویستی قوربانی کردنیشی هەبوو، تەوبە بکات، و هیچ کەفارەتی لەسەر نییە، و قوربانییەکەی دروستە.

٢. دروست نییە پێستەی یان گۆشتی قوربانی بفرۆشرێت، حاکم و بەیهەقی لە ئەبوهورەیرەوە ﵁ ڕیوایەتیانکردووە و

ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ باع جلْدَ أُضْحِيَتِهِ، فلا أضْحِيَةَ لَهُ)).

واتە: هەرکەسێك پێستەی قوربانییەکەی بفرۆشێت، قوربانی بۆ نییە.

و ئەبوداود لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أمَرَني رسولُ اللهِ ﷺ أنْ أقومَ على بُدْنِه، وأقسِمَ جُلودَها وجِلالَها، وأمَرَني ألّا أُعطيَ الجَزّارَ منها شَيئًا، وقال: نحنُ نُعطيه مِن عندِنا)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم سەرپەرشتی حوشترەکانی هەدی بکەم، و پێستە و ئەو شتانەی لە گەردن و لەسەر پشتیانە دابەش بکەم، و فەرمانی پێکردم لە گۆشتەکەی بەشی ئەو کەسە نەدەم کە سەریان دەبڕێت، و فەرمووی: ئێمە خۆمان حەق دەستی پێدەدەین.

نەوەوی دەڵێت: دروست نییە هیچ شتێك لە ئاژەڵی هەدی و قوربانی بفرۆشرێت[٤٧]؛ و شەوکانی دەڵێت: کۆڕان کە گۆشت و پێستەکەی نافرۆشرێت[٤٨].

(٤٧). (المجموع)(٤١٩/٨).
(٤٨). (نيل الأوطار)(١٥٣/٥).

٣. قوربانی بۆ مردوو، لە سوننەتدا نەهاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ خەدیجەی هاوسەری و کچەکانی وەفاتیانکردووە و قوربانی بۆ نەکردوون، هەروەها حەمزەی مامی و جەعفەری ئامۆزای شەهیدبوون قوربانی بۆ نەکردوون، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: لە بنەڕەتدا قوربانی بۆ زیندووە، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی قوربانییان بۆ خۆیان و خێزانەکانیان دەکرد، و ئەوەی هەندێك خەڵکی عەوام گومانی تایبەتکردنی قوربانی دەکەن بۆ مردووان هیچ بنەمایەکی نییە، و قوربانیکردن بۆ مردوو سێ جۆرە:

یەکەم: کەسێك قوربانی بکات بۆ خۆی و کەسوکاری و نییەتی ئەوەی هەبێت کەسوکارە مردووەکەی لە پاداشتەکەی بەشداربن، و بەڵگەش لەسەر ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی و کەسوکاری قوربانیکردووە، و هەندێك لە کەسوکاری مردووە.

دووەم: قوربانی بکرێت بۆ مردوو، وەك جێبەجێکردنی وەسیەت "واتە کەسێك وەسیەت بکات دوای مردنی قوربانی بۆ بکەن"، بنەمای ئەم بابەتە ئەو فەرموودەیەی خوایە ﷻ کە دەفەرموێت: ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ١٨١﴾(البَقَرَةِ).

واتە: هەرکەسێك وەسیەتی وەسیەتکار بگۆڕێت دوای ئەوەی کە دەیبیستێت بێگومان تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسانەیە کە وەسیەتەکە دەگۆڕن، بە دڵنیاییەوە خوا بیسەر و زانایە.

سێیەم: قوربانی بکرێت بۆ مردوو بە سەربەخۆی و بیٚ هاوبەشی زیندووەکان، ئەمە دروستە، فەقیهەکانی مەزهەبی حەنبەلی دەڵێن: پاداشتی دەگاتە مردوو و سودی لیٚ دەبینن، بە قیاسکردنی لەسەر بەخشین بۆ مردوو، بەڵام ئێمە وانابینین تایبەتکردنی مردوو بە قوربانی لە سوننەت بێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی نەکردووە بۆ حەمزەی مامی کە لە خۆشەویسترین مردووەکانی بووە بە لایەوە، و نەبۆ منداڵەکانی کە سیٚ کچ و سیٚ کوڕی بچووك بوون، و نەبۆ خەدیجەی کە خۆشەویسترین هاوسەری بوو، و لە هاوەڵانەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتووە کە یەك کەسیان قوربانی بۆ مردووی کردبێت، و ئەوەش بە هەڵە دەزانین کە هەندێك خەڵك قوربانی بۆ مردوو دەکەن لە ساڵی یەکەمی مردنیدا[٤٩].

---

(٤٩). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٢١-٢٢٢).

٤. قوربانی کردن بۆ ئوممەتی ئیسلام تایبەتمەندی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئیبن ماجە و تەبەرانی لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((ضحّى رسولُ اللهِ ﷺ بكبشَيْنِ أقرنَيْنِ أملحيْنِ أحدِهما عنهُ وعن أهلِ بيتِه، والآخرِ عنهُ وعمَّن لم يُضَحِّ من أمَّتِه)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی شاخداری ڕەنگ سپی ڕەشباوی کرد بە قوربانی، یەکێکیان بۆ خۆی و کەسوکاری، و ئەویتریان بۆ خۆی و ئەو کەسانەی لە ئوممەتەکەی قوربانییان نەکردووە.

دوای ئەوەی ئەلبانی لە (إرواء الغليل)دا باسی ئەو فەرموودانە دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی بۆ ئەو کەسانە کردووە لە ئوممەتەکەی کە قوربانییان نەکردووە، دەڵێت: ئەوە لە تایبەتمەندی پێغەمبەری خوایە ﷺ وەك ئیبن حجر لە (الفتح)(٩/٥١٤)دا لە زانایانەوە ئەوەی باسکردووە، لەبەر ئەوە دروست نییە لەمەودا کەس چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات و قوربانی بکات بۆ ئوممەتی ئیسلام[٥٠].

---

(٥٠). (إرواء الغليل)(٤/٣٥٤).

٥. ئەو کەسەی قوربانی دەکات پێویستە لێی بخوات، و لێی ببەخشێت، و لێی پاشەکەوت بکات، و هەتا زیاتری لێ ببەخشێت باشترە، بوخاری لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیکردووە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن ضَحّى مِنكُم، فلا يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثالِثَةٍ وبَقِيَ في بَيْتِهِ منه شَيءٌ، فَلَمّا كانَ العامُ المُقْبِلُ، قالوا: يا رَسولَ اللَّهِ، نَفْعَلُ كما فَعَلْنا عامَ الماضِي؟ قالَ : كُلُوا وأَطْعِمُوا وادَّخِرُوا، فإنَّ ذلكَ العامَ كانَ بالنّاسِ جَهْدٌ، فأَرَدْتُ أنْ تُعِينُوا فيها)).

واتە: ئەو کەسەی قوربانی دەکات دوای سێ ڕۆژ هیچی لە ماڵدا لێ نەهێڵێتەوە، ساڵی ئایندە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا وەك ساڵی ڕابردوو بکەین، فەرمووی: لێی بخۆن و لێی ببەخشن و لێی هەڵبگرن، ئەو ساڵە ساڵی قاتوقڕی و نەهامەتی بوو، ویستم یارمەتی خەڵك بدەن.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەگەر برسێتی بوو دروست نییە زیاتر لە سێ ڕۆژ گۆشتی قوربانی هەڵبیگرێت[٥١].

٦. ئایا ئەگەر کەسێك پارەی ئاژەڵی قوربانی ببەخشێت باشترە؟ لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵاندا هەژار و نەداری زۆر

(٥١). (أحكام الأضحية والذكاة)(٢٥٢).

هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان پارەی قوربانییەکەیان نەکردووەتە صەدەقە و واز لە سەربڕینی قوربانی بهێنن، و ئەگەر بەخشینی پارەی قوربانی باشتربووایە لە سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی بێگومان ئەوەیان دەکرد، ئیبن تەیمییە دەڵێت: قوربانی و گوێزەبانە و هەدی باشترە لە بەخشینی بەهاکانیان[٥٢].

٧. ئایا موسڵمان دەتوانێت گۆشتی ئاژەڵێك بکڕێت و ببیبەخشێت لە بری سەربڕینی قوربانی؟، وەك زانراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵی سەربڕیوە، هەروەها هاوەڵان، کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین سەرمەشقە بۆ موسڵمانان، و باشترین هیدایەت و ڕێگا، هیدایەت و ڕێگاکەیەتی.

٨. کەسی قەرزار قوربانی لەسەر پێویست نییە، بەڵام ئەگەر توانی قەرزەکە بداتەوە باشتروایە ئاژەڵێك بکڕێت و بیکات بە قوربانی و خۆی لەو پاداشتە بێبەش نەکات، ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەگەر توانی دواتر قەرزەکە بداتەوە باشتروایە قوربانی بکات، بەڵام پێویست نییە لەسەری ئەوە بکات[٥٣]؛ و ئیبن باز دەڵێت: ئاساییە موسڵمان قەرز بکات بۆ ئەوەی قوربانی پێبکات، ئەگەر

---

(٥٢). (مجموع الفتاوى)(٣٠٤/٢٦).
(٥٣). (مجموع الفتاوى)(٣٠٥/٢٦).

توانای هەبوو قەرزەکە بداتەوە[٥٤]؛ و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەگەر کەسێك پارەی قوربانی نەبوو لە کاتی جەژندا، بەڵام ئومێدی هەبوو دوای ئەوە دەستی بکەوێت وەك کەسێکی فەرمانبەر لە کاتی جەژندا پارە بە دەستییەوە نەبێت، بەڵام ئەگەر مووچەکەی وەرگرت دەتوانێت قەرزەکەی بداتەوە، لەم حاڵەتەدا ئاساییە قەرز بکات[٥٥].

٩. کەسێك لەسەفەردا بێت یان لە وڵاتێکی تر بژی قوربانی لەسەر ناکەوێت، دەتوانێت کەسێك ڕابسپێرێت یان خۆی لە سەفەرەکەیدا یان لەو وڵاتە قوربانی بکات، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەگەر کەسێك سەفەر بکات و کەسوکاری لەگەڵ نەبێت، باشتروایە کەسێك ڕابسپێرێت لە وڵاتەکەی خۆی قوربانی بۆ بکەن، بەڵام ئەگەر کەسوکاری لەگەڵ بوو قوربانی لەو شوێنە دەکەن کە جەژنیان بەسەردا دێت[٥٦].

  

---

(٥٤).(مجموع فتاى)(٣٨/١٨).
(٥٥). (مجموع الفتاوى)(١١٠/٢٥).
(٥٦). (لقاء باب المفتوح)(٢٠/٩٢).

# ناوەڕۆک

